درزێکی پڕ لە زووخاوە
هەموو جارێ بە پیاڵەیەک،
دەیشۆمەوە
دوای دەمێکی دەزێتەوە
شۆڕانەوەی هەر یەک دەمە
میوانێکی نەخوازراوە
دەری دەکەم، هەر دێتەوە
نێوی خەمە ...

"مەسعوود تەهازادە"

## پێشکەش بە هەموو کورد زمانەکانی دنیا

هەناسەم دەرنایە، فرمێسک لە چاوم دێتەخوار، زارم کرە، سەرم گێژە، دڵم گیراوە، جەستەم ماندوو، کەوتوو و شلە و بەبێ توانا لەناو جێخەودا کەوتووم. باسکەکانم بە دەرزی "ئەنژێکسیۆن" کون‌کون بوون. جێخەو، بۆنی ئارەقە و گەرمای لەشی لێدێ. چاو لە کاتژمێرێک دەکەم کە لەسەر مێزە بچووکەکەی پەنا جێخەو دانراوە. کاتژمێر دەی ڕۆژی یەکشەممۆیە. دەڕوانمە تاقی ژوورەکە کە چرای پێ هەڵاوەسراوە. دەڕوانمە دەوروبەری ژوورەکەم، کاغەزی دیوار، گوڵ و بەردی سووری پێوەیە و پشتی خۆڵاوییە. مەودا بە مەودای، دوو باڵندەی ئەویندار کە بەرامبەری یەکتر لەسەر لقێکی دار هەڵنیشتوون، یەکیان دندووکی کردۆتەوە، دەڵێی لەگەڵ ئەوی تر گفتگۆ دەکا. ئەو نیگارەیە ڕامدەپەڕێنێ. نازانم هۆی چییە، بۆ هەرلایەکی دەخزێم و دەسووڕێم، هەر لەپێش چاومە. سەر مێزی ژوورەکە پڕە لە شیشە، فتیلە و قتووی دەرمان. بۆنی ئەڵکۆڵی سووتاو، بۆگەنی ژوورێکی ناخۆش لە هەوادا بڵاو بۆتەوە. دەمهەوێ هەستمە سەرپێ و پەنجەرە بکەمەوە، بەڵام بێهێزییەکی زۆر، منی بە جێخەوەوە بەستۆتەوە. دەمهەوێ جگەرە بکێشم، ئیشتیام لێی نیە. دە خولەک تێپەڕ نەبوو، ڕیشم کە درێژ ببوو تاشیم. هاتم و کەوتمە سەر جێخەو. چاوم کە لە ئاوێنە کرد، بینیم زۆر کز و لاواز بووم، بە ئەستەمی بەڕێگادا دەڕۆیشتم، ژوورەکەم شپرزە و ئاڵۆزە، من تەنیام.

هەزار جۆرە بیری سەیروسەمەرە لە مێشکمدا دەسووڕێ، دەگەڕێ. هەموویان دەبینم، بەڵام بۆ نووسینی بچووکترین هەست یا بچووکترین خەیاڵێکی تێپەڕاو، دەبێ سەراسەری ژیانم باس بکەم و ئەوەش ناگونجێ. ئەو بیرانە، ئەو هەستانە، بەرهەمی دەورانێک لە ژیانی منن. بەرهەمی شێوازی

ژیان، ئەو بیر و باوەڕانەی وەرمگرتوون و ئەو شتەن کە بینیومە، بیستوومە، خوێندوومەتەوە، هەستم پێکردووە یا هەڵمسەنگاندووە. هەموو ئەوانە بوونی خەیاڵی و پووچی منیان دروست کردووە.

لە ناو جێخەوەکەمدا دەخزێم، دەستنووسەکانی بیرەوەریم تێکەڵ دەکەم. بیری پەرێشان و شێتانە گوشار بۆ مێشکم دێنێ، پشتسەرم دێشێ، سۆزی پێدا دێ، لاجانگەکانم گەرم داهاتوون، لە خۆمدا دەتلێمەوە. لێفەکە لە پێش چاوم ڕادەگرم، بیر دەکەمەوە، ماندوو بووم، بریا دەمتوانی کاسەی سەرم بکەمەوە و هەموو ئەو تۆپەڵە نەرم و بۆرە پێچ پێچ و لێکئاڵاوەی مێشکم دەردێنا و فڕێم دەدا، دەمخستە پێش دمی سەگ.

هیچکەس نازانێ، هیچکەس باوەڕ ناکا، ئەگەر کەسێک دەستی لە دنیا بوویێتەوە، پێی دەڵێن: بڕۆ سەرت لەسەر عەرز دانێ و بمرە. بەڵام کاتێک مردنیش نایهەوێی، کاتێک مردنیش پشتت تێدەکا، مردنێک کە نایە و نایهەوێ کە بێ.

هەموو کەس لە مردن دەترسێ، من لە ژیانی لاساری خۆم.

چەند ترسناکە کاتێک کە مردن نایهەوێی و لێت دەکشێتەوە. تەنیا شتێک من دەلاوێنێتەوە: دوو حەوتوو پێش بوو، لە ڕۆژنامەدا خوێندمەوە کە لە نەمسا (ئوتریش)، کەسێک سێزدە جار، بە شێوازی جۆراوجۆر، ویستوویە خۆ بکوژێ و هەموو جۆرەکانی خۆکوژی پێواوە، خۆی هەڵاوەسیبوو و تەناف پچڕابوو، خۆی لە ڕووبار هاویشتبوو و لە ئاویان هێنابووە دەر و ... لە ئاکامدا بۆ دوایین جار کە ماڵەکەی خەڵوەت ببوو، بە چەقۆی چێشتخانە هەموو ڕەگ و دەمارەکانی خۆی بڕیبوو و ئەوکات لە سێزدەهەمین جاردا دەمرێ.

ئەوە من دەلاوێنێتەوە.

نا، کەس بڕیار بۆ خۆکوژی نادا، خۆکوژی هەر خۆی لەگەڵ هێندێک کەسە. لە تاروپۆ و لە ناخیاندایە. ناتوانن لە دەستی ڕابکەن. ئەوە چارەنووسە کە دەسەڵاتی بەدەستە، بەڵام لە هەمان کاتدا، ئەوە منم کە چارەنووسی خۆم دروست کردووە. ئێستا ئیتر ناتوانم لە دەستی ڕابکەم، ناتوانم لەدەست خۆم ڕابکەم.

بەهەر شێوە، دەتوانم چبکەم؟ چارەنووس لە من بەهێزترە.

چ خواست و هەوەس گەلێک دێتە ناو مێشکم، هەر لە حاڵی خەودا بووم کە حەزم دەکرد منداڵێکی بچووک بووبام. هەمان "گوڵین باجی" کە چیرۆکی بۆ دەخوێندمەوە و تفی قووت دەدا، ئێستا لەسەر سەرم دانیشتبوو، من هەروا ماندوو لەناو جێخەودا کەوتبووم، ئەو بە زمانخۆشی و جوانی چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە و بە ئەسپایی چاوەکانم دەکەوتنە سەر یەک. وابزانم هێندێک لە بیرەوەرییەکانی ژیانی منالّی بە باشی دێتەوە بیرم. دەڵێی دوێنێ بووە، دەبینم کە هێندەش زۆرم مەودا نییە لەگەڵ کاتی منالّیم. ئەوجار سەراسەری ژیانی ڕەش، پەست و بێهوودەی خۆم دەبینم. ئایا ئەوکات خۆشبەخت بووم؟ نا! چ هەڵەیەکی گەورەیە. هەمووکەس گومان دەکا کە منالّ خۆشبەختە. نا، باش لە بیرمە، ئەوکات هەستیارتر بووم. ئەوکاتیش لاسایی‌کار و ئاوری ژێر ئاگر بووم. ڕەنگە بە ڕووالّەت پێدەکەنیم و یاریم دەکرد، بەڵام لە ناوخۆمدا کەمترین لاتاو یا ڕووداوی ناخۆش و بێهوودە، چەندیدن کاتژمێری دوور و درێژ بیری منی ئالّۆز دەکرد و غەم و پەژارە دایدەگرتم. بەگشتی، سرووشت عەمری نەمێنێ، حەق بەو کەسانەیە کە دەڵێن

بەهەشت و دەوزەخ لەناو خۆی مرۆڤەکاندایە، هێندێک کەس بە خۆشی دێنە سەر دنیا و هێندێک بە ناخۆشی.

چاو لەو لەتە قەڵەمە سوورەی دەکەم کە بە دەستمەوەیە و لەناو جێخەودا پێی دەنووسم، هەر بەو قەڵەمە بوو کە شوێنی ژوانی خۆم نووسی و دام بەو کچەی کە تازە لەگەڵی ببوومە هاوڕێ. دوو سێ جار بەیەکەوە ڕۆیشتینە سینەما. جاری کۆتایی، فیلمی "ئاوازخوێن و بێژەر" بوو، لە بەرنامەکەدا، ئاوازخوێنی بەناو بانگی شیکاگۆ دەیخوێند Where is my si? lvia. زۆرم حەز لێی بوو، چاوەکانم بەست، گوێم دەدایە، ئاوازی بەهێز و سرنجڕاکێشی هێستاش لە گوێمدا دەزرینگێتەوە. تەلاری سینەما دەلەرزییەوە. وام بیردەکردوە کە نابێ هیچکات بمرێ، نەمدەتوانی باوەڕ بکەم کە ئەو دەنگە ڕۆژێک دەبێ خامۆش بێ. لە شێوازی خوێندنی بەسۆزی، خەم دایگرتبووم، لەهەمان کاتیشدا لە بیستنی بەکەیف بووم. بەرز و نزم سازیان دەژەنی، دەنگی خزین و ئەو ناڵەیەی کە لە سیمی ویۆڵۆنەوە دەهاتەدەر، وەک ئەوە وابوو کە کەمانەی ویۆڵۆنیان لەسەر ڕەگ و دەماری من دەخزاند و هەموو تار و پۆی لەشمیان ئاوێتەی ساز دەکرد، دەیلەرزاندم و دەیبردمە ناو شوێنگەلێکی خەیاڵی. لە ناو تاریکیدا، دەستم لە مەمکەکانی ئەو کچە دەخشاند، چاوەکانی خومار دەبوون. منیش دۆخێکی غەریب دایدەگرتم. لەبیرمە، دۆخێکی خەمناک و خۆش بوو کە باسی ناکرێ. لێوە تەڕ و جوانەکانیم ماچ دەکرد، کوڵمەکانی گەشابوونەوە. یەکترمان لە ناو ئامێزدا گوشار دەدا، نەمزانی بابەتی فیلمەکە چییە. یاریم بە دەستەکانی دەکرد، ئەویش خۆی بە منەوە نووساندبوو. ئێستا دەڵێی خەونم بینیوە. لە دوایین ڕۆژەوە کە لەیەک جیا بووینەوە تا ئێستا، ئەوە نۆ ڕۆژی بەسەردا تێپەڕ بووە.

وای دیاری کرد کە سبەی بچم لە دوای و بیهێنمە ژوورەکەی خۆم. ماڵەکەی لە نزیک گۆڕستانی "منپارناس" بوو، هەمان ڕۆژ ڕۆیشتم بیهینم، لەوێ، لە گۆشەی کۆڵان لە مێترۆ دابەزیم، بایەکی سارد هەڵیکردبوو، کەشوهەوا هەوراوی و مات بوو، نازانم چ ڕوویدا کە پەشیمان بوومەوە. ئەوە نەبوو کە بڵێم ناشیرنە یا خۆشم نەوێ، بەڵام هێزێکی نادیار ڕایگرتم. نا، نەمەویست چی تر ببینم، دەمەویست هەموو هۆگرییەکانم لە ژیان ببڕمەوە. بێخواست، ڕۆیشتم بۆ لای گۆڕستان. لەبەر دەرگا، پاسەوانی گۆڕستان خۆی لە عەبایەکی سوورمەیی ڕەنگ پێچابوو. بێدەنگییەکی سەیر لەوێ وڵاتی لە ژێر دەسەڵاتی خۆی گرتبوو. من بە ئەسپایی هەنگاوم هەڵدێناوە. چاوم لە کێلەکان، خاچگەلێک کە لەسەریان دانابوون، گوڵی دەستکردی ناو گوڵدانەکان و سەوزەگیاکانی قەراغ یا سەر گۆڕەکان دەکرد. ناوی هێندێک لە مردووکانم دەخوێندەوە، داخم دەخوارد کە بۆ لە جێی ئەوان نیم، بیرم دەکردەوە: ئەوانە چەند خۆشبەخت بوون. بەخیلیم بەو مردووانە دەبرد کە جەستەیان لەبن خاک و خۆڵدا لێک بڵاو ببوو. هیچکات هەست بە بەخیلی کردنێکی بەمجۆرە لە مندا نەببوو. وام هاتە بەرچاو کە مردن جۆرێک خۆشبەختی و بەخششێکە کە نایدەن بە هەر کەسێک. نازانم چەندی خایاند، کپ چاوم لێدەکرد، کچەکەم بە تەواوی لەبیر کردبوو. هەستم بە سەرما نەدەکرد، وەک ئەوە بوو کە مردووکان لە من نزیکتر بن تا زیندووکان. لە زمانی ئەوان باشتر تێدەگەیشتم. گەڕامەوە، نا، ئیتر نەمدەویست ئەو کچە ببینم. دەمەویست لە هەموو شتێک و لە هەموو کارێک بکشێمەوە، دەمەویست بێهیوا ببم و بمرم. ئەو بیرە بێهوودانەی بە مێشکمدا دێ... ڕەنگە قسەکانم بێجێ بن.

چەند ڕۆژێک بوو کە بە وەرەقی قومار فاڵم دەگرتەوە. نازانم چۆن بوو کە باوەڕم بە خوڕافە هێنابوو. بە ڕاستی فاڵم دەگرتەوە، واتا هیچ کارێکی ترم نەبوو. نەمدەتوانی کارێکی تر بکەم. دەمەویست لەسەر داهاتووی خۆم قومار بکەم. نیەتم هێنا، بینیم سێ کاتژمێر و نیو دوابەدوای یەک فاڵم گرتۆتەوە. لە سەرەتادا برِم لێدەدا، دوایی لەسەر کورسی، وەرەقێکم لە ڕوو ڕیز دەکرد و پێنجی تریش لە پشت. ئەوکات لەسەر وەرەقی دووهەم کە لە پشت بوو، وەرەقێکم لە ڕوو و چواری ترم لە پشت ڕیز دەکرد. هەر بەو شێوەیە تا ئەوەی کە لەسەر وەرەقی شەشەمیش، وەرەقێک لە ڕوو دادەندرا. دوایی جۆرێکم ڕیز دەکرد کە خاڵێکی ڕەش و خاڵێکی سوور، مەودا بە مەودا، بەرامبەر یەکتر بن، بە ڕیز: شا، ژن، سەرباز، بەرگی دەخاڵ، بەرگی نۆخاڵ و بەم شێوەیە. هەر ژوورێک کە دەکراوە، بەرگی ژێرەوەیم لەڕوو دادەنا، وە ئەگەر وەرەقێکی بەکەڵک با، لەسەر ژوورەکان دەمچنین، بەڵام نەدەبوو لە شەش ژوور زۆرتر بن. تەکخاڵەکانم بە جیا لەسەر ژوورەکان دادەنا، بە جۆرێک کە ئەگەر فاڵێکی باش دەرکەوتبا، هەموو وەرەقەکانی ژوورەکانی خواروو، بە ڕیز لەسەر یەکەکانی هاوڕەنگی خۆیان دادەندران. ئەو جۆرە فاڵە سەردەمی منالّی فێر ببووم و کاتم پێ ڕادەبوارد.

حەوت هەشت ڕۆژ پێشتر، لە قاوەخانەدا دانیشتبووم. دوو کەس ڕووبەڕووی من یاری تەختەنەردیان دەکرد. یەکیان بە ڕەفیقەکەی کە بە ڕوخساری سوور و سەری کەچەڵەوە جگەرەیەکی بە ژێر سمێڵی ئاوێزانییەوە نابوو و بە سیمایەکی گەمژانە چاوی لێدەکرد، گوت: هەرگیز نەبووە کە من قومارێک ببەمەوە، لە دەجار، نۆجاریان دەدۆڕێنم. من مات چاوم لێدەکردن، چیم دەبا گوتبا؟ نازانم. بەهەر شێوە، دوایی هاتمە ناو کۆڵانەکان، بەبێ

خواستی خۆم بە ڕێگادا دەڕۆیشتم، چەند جار وام بیر کردەوە کە چاوەکانم ببەستم و بچە پێش ئۆتۆمبیل تا تەگەرەکانی بەسەرمدا تێپەڕ بن، بەڵام ئەوە شێوازێکی ناخۆش بوو بۆ مردن. دوای ئەوەش، کوا ئاسوودە دەبووم؟ ڕەنگە دیسان زیندوو مابام. ئەو بیرەیە کە شێتم دەکا. دوایی هەر ئاوا لە چوارڕێیەکان و شوێنە قەرەباڵغەکان تێپەڕ دەبووم. لە نێوان ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە لە حاڵی تێپەڕیندا بوون، لە نێوان دەنگی ناڵی ئەسپەکان، عارەبانەکان، کەڕەنای ئۆتۆمبیلەکان، هەراوهۆریا و ئاژاوەدا، تاق و تەنیا بووم. لە ناو چەندین میلیۆن کەس، وەک ئەوە بوو کە لە ناو بەلەمێکی شکاودا دانیشتبێم و لە دەریادا ون بووبێم. هەستم دەکرد کە بە ناحەزی منیان لە کۆمەڵگای مرۆڤەکان دەر کردووە. تێدەگەیشتم کە بۆ ژیان بردنەسەر نابم، هەر هۆ و بەڵگەم بۆخۆم ڕیز دەکرد و هەنگاوی هاوسەنگم هەڵدێنا. لە پشت شیشەی ئەو دووکانانەی کە شاشەی نیگارکێشییان هەڵاوەسیبوو، ڕادەوەستام، هێندێک تێیان ڕادەمام و داخم دەهات کە بۆ نیگارکێش نەبووم، تەنیا کارێک بوو کە حەزم لێی بوو. لەناو خۆمدا بیرم دەکردەوە و بەوە دەگەیشتم کە تەنیا نیگارکێشانەوە بوو کە دەیتوانی بملاوێنێتەوە. پۆستچییەک بە پەنامدا تێپەڕ دەبوو و لە پشت چاویلکەکەی، کاغەزێکی دەخوێندەوە، چ بیرگەلێک هاتە ناو مێشکم؟ نازانم، پێموایە پۆستچی ئێران، یا بریکاری پۆستی ماڵێم هاتەوە بیر.

دوێنێشەو بوو، چاوەکانم لەسەر یەکتر گوشار دەدا، خەوم لێنەدەکەوت، بیری ورد و بڕاو، شاشەگەلی هەستیار دەهاتنە بەر چاوم. خەون نەبوو، چون هێستا خەوم لێنەکەوتبوو. تارمایی بوو، نە خەوم لێکەوتبوو و نە بەخەبەر بووم، بەڵام دەمبینین. جەستەم سست، ماندوو، ناخۆش و قورس

بوو و سەریشم دەئێشا. ئەو تارمایی ترسناکانە لە پێش چاوم تیپەڕ دەبوون، ئارەقە لە جەستەم دەتکاوە، ڕوخساریان دیار نەبوو. شەوی تاریک و جەرگبڕ پڕ ببوو لە هەیکەلی ترسناک و تووڕە، کاتێک کە دەمەویست چاوەکانم ببەستم و خۆم ڕادەستی مەرگ بکەم، ئەو وێنە سەرسووڕهێنەرانە وەدیار دەکەوتن. ئەڵقەیەکی گڕکان کە بە دەوری خۆیدا دەسووڕا، مردوویەک کە لە ڕووباردا سەرئاوکەوتبوو، چاوانێک کە لە هەموو لایەکەوە لە منیان دەڕوانی. ئێستا بەباشی دێتەوە بیرم کە شتهایەکی دێوانە و تووڕە هێرشیان بۆ هێنابووم. پیرێکی مردوو، بە ڕوخسارێکی خوێناوییەوە بە کۆڵەکەیەکەوە بەسترابوو، چاوی لە من دەکرد، پێدەکەنی، ددانەکانی دەدرەوشانەوە. شەمشەمەکوێرەیەک بە باڵە ساردەکانی ڕوخسارمی دەکوتا. لەسەر تەنافێکی باریک هەنگاوم هەڵدێنا، لە بن تەنافەکەوە گێژاوێک بوو، دەخزیم، دەمەویست هاوار بکەم، دەستێک دەهاتە سەر شانم، دەستێکی ڕەق هەڵاتوو ئەوکمی گوشار دەدا، هەستم دەکرد کە دڵم لە لێدان دەکەوێ. ناڵە، ناڵەگەلێکی شووم کە لە قوڵایی تاریکی شەوڕا دەهاتنە دەر. سیمای کەسانێک کە سێبەریان نەبوو لە ناکاو وەدیار دەکەوتن و ون دەبوون. لە بەرامبەریاندا دەمتوانی چبکەم؟ لە یەک کاتدا هەم دوور بوون و هەم نزیک، نا، من لە خەوندا نەمدبینین، چون هێستا خەوم لێنەکەوتبوو.

نازانم هەمووکەسم جادوو کردووە یا خۆم جادوو کراوم، بەڵام بیرێک، ئاڵۆزی کردووم، ناتوانم پێش پێکەنینم بگرم، هێندێک کات پێکەنین پێش گەرووم دەگرێ. دواجار کەس نەیزانی نەخۆشی من چییە، هەموو فریویان خوارد. حەوتوویەکە خۆم لە نەخۆشی داوە یا نەخۆشییەکی نامۆم گرتووە. بەبێ خواستی خۆم، جگەرەم هەڵگرت و هەڵمکرد، بۆ جگەرە دەکێشم؟ بۆخۆشم

نازانم. ئەو دوو قامکەی کە جگەرەکەیان لە ناودایە، بە دەممەوە دەنێم. دووکەڵەکە دەدەمە دەر، ئەوەش جۆرێک نەخۆشییە.

ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە، جەستەم دەلەرزێ، حەوتوویەک بوو، شۆخی نییە کە خۆم بە شێوازی جۆراوجۆر ئەشکنجە دەدا، دەمەویست نەخۆش بم. چەند ڕۆژێک بوو کەشوهەوا سارد ببوو، لە سەرەتادا چووم و شێرەی ئاوی ساردم بە سەرخۆمدا بەرداوە، پەنجەرەی حەمامم کردەوە، ئێستا کە دێتەوە بیرم، حاڵم خراپ دەبێ. هەناسەم دەرنەهات، پشت و سینگم ئێشا، لەناو خۆمدا گوتم ئیتر هەموو شتێک تەواوە، سبەی سینگئێشەیەکی توند دەگرم و لە نەخۆشخانە دەکەوم، دوایی ئێش و نەخۆشییەکە زۆر دەکەم و ئیتر خۆم لە ژیان دەرباز دەکەم. سبەی بەیانی کە لە خەو هەستام، هیچ هەستێکم بە سەرمابوون نەکرد، دیسان جلەکانم کەم کردەوە، ئاسمان کە تاریک داهات، دەرگام داخست، چرام کوژاندەوە، پەنجەرەی ژوورەکەم کردەوە و لەبەر سۆزی سەرمادا دانیشتم. بایەکی سارد دەهات. زۆر بەتوندی دەلەرزیم، گوێم لە دەنگی ددانەکانم دەبوو کە وێک دەکەوتن. چاوم لە دەرەوە دەکرد، خەڵکێک کە خەریکی هاتوچۆ بوون، سێبەری ڕەشیان، ئەو ئۆتۆمبیلانەی کە تێپەڕ دەبوون، لەسەر نهۆمی شەشەمەوە بچووک دیار بوون. جەستەی ڕوتم خۆمم ڕادەستی سەرما کردبوو و لە سەرمان لەخۆم دەئاڵام، هەر ئەوکات ئەو بیرە هاتە ناو مێشکم کە شێت بووم، پێکەنینم بەخۆم دەهات، پێکەنینم بە ژیان دەهات، پێکەنینم بەو مرۆڤانە دەهات کە دەمزانی لەو دنیایەدا کە وەک ئەکتەرخانەیەکی گەورەیە، هەرکەس جۆرێک دەور دەگێڕێ تا ئەوەی کاتی مردنی دەگا. منیش ئەو یارییەم دەکرد، چون گومانم دەکرد کە من زووتر لە دەور دەخاتە دەر. لێوەکانم ویشک ببوون،

سەرما جەستەمی ئازار دەدا، دیسان سوودی نەبوو، خۆم گەرم کردەوە، ئارەقەم هەڵدەڕشت، لە ناکاو خۆم ڕووت دەکردەوە، شەو تا بەیانی لەسەر جێخەو کەوتم و دەلەرزیم، خەوم لێنەکەوت. هێندێک سەرمایی دەبووم، بەڵام هەر کە هێندێک دەخەوتم، نەخۆشی بە تەواوی لە ناو دەچوو. زانیم کە ئەوەش سوودی نییە، سێ ڕۆژ بوو کە هیچم نەدەخوارد و شەوان دوابەدوا ڕووت دەبوومەوە و لەبەر پەنجەرە دادەنیشتم، خۆم ماندوو دەکرد، شەوێک تا بەیانی بە زگی بەتاڵ لە ناو کۆڵانەکانی پاریسدا هەڵاتم، ماندوو بوم، ڕۆیشتم لەسەر پێپلیکانەیەکی سارد و تەڕ لە کۆڵانێکی تاریکدا دانیشتم. شەو لە نیوە تێپەڕ ببوو، کارگەرێکی مەست کە بەلادا دەهات، لەپەنام تێپەڕ بوو، لەبەر ڕووناکایی ون و سیحراوی چراگاز، ژن و پیاوێکم بینی کە قسەیان دەکرد و تێپەڕ دەبوون. دوایی هەستامە سەرپێ و وەڕێکەوتم، لەسەر کورسییەکانی شەقام، بێ ماڵوحاڵە چارەڕەشەکان خەوتبوون.

لە کۆتاییدا، لەبەر بێتوانایی لە نەخۆشخانەدا کەوتم، بەڵام نەخۆش نەبووم. هەروەها هاوڕێکانم دەهاتنە لام. لەبەرچاوی ئەوان خۆم دەلەرزاند، وەها سیمایەکی نەخۆشم نیشان دەدا، کە دڵیان بۆم دەسووتا. گومانیان دەکرد کە سبەی ئیتر دەمرم. دەمگوت دڵم دەگیرێ، کاتێک کە لە ژوورەکە دەردەکەوتن، بە گەمژەییان پێدەکەنیم. بیرم دەکردەوە کە ڕەنگە لە دنیادا یەک کارم لە دەست بێ: دەبوو ببمە شانۆگەر.

هەر ئەوجۆرەی لە لای هاوڕێکانم دەورم دەگێڕاو خۆم نەخۆش نیشان دەدا، لە لای دوکتورەکانیش هەر وام دەکرد. هەموویان باوەڕیان کردبوو کە بەڕاستی نەخۆشم. هەرچی لێیان دەپرسیم، دەمگوت دڵم دەگیرێ. چون

مردنی لە ناکاو تەنیا بە دڵەوە دەبەستراوە، ئەگینا سینگ ئێشەیەکی کەم، یەکجێ کوشندە نەبوو.

ئەوە موعجزە بوو. کاتێک بیری لێدەکەمەوە، دۆخێکی نامۆ دامدەمگرێ، حەوت ڕۆژ بوو کە خۆم ئەشکنجە دەدا، ئەگەر بە پێداگری هاوڕێیانم چاییەکم لە سێحەبماڵ وەردەگرت و دەمخواردەوە، حاڵم باش دەبوو. ترسناک بوو، نەخۆشی بە تەواوی لە ناو دەچوو. زۆرم حەز دەکرد کە ئەو نانەی لە پەنا چاییەکەیان داناوە بیخۆم، بەڵام نەمدەخوارد. هەموو شەوێ بە خۆم دەگوت، ئەوا کەوتووم و سبەی ئیتر ناتوانم هەستمەوە. هێندێک دەفرم دەهێنا کە پڕم کردبوون لە تریاک. لە سندووقی مێزە بچووکەکەی پەنا جێخەوەم دەخست تا کاتێک کە نەخۆشی بە تەواوی خستمی و ئیتر نەمتوانی لە شوێنی خۆم ببزوێم، دەریان بێنم و بیانخۆم. چارەڕەشانە، نەخۆشی نەدەهات و نەیدەویست بێ. جارێک کە لەلای یەکێک لە هاوڕێیانم ناچار لەتە نانێکی بچووکم لەگەڵ چایی خوارد، هەستم کرد کە حاڵم باش بووە، بە تەواوی باش بووم. لە خۆم ترسام، لە بە تاقەت بوونم ترسام. ترسناک بوو، جێی باوەڕ نییە. ئەوانە کە دەنووسم هۆشم لەسەرە خۆمە. وشەی بێجێ نانووسم، زۆر باش لە بیرمە.

ئەوە چ هێزێک بوو کە لە مندا بەدەرکەوتبوو؟ بینیم کە هیچیەک لەو کارانە سوودی نییە، دەبوو بە ڕاستی نەخۆش ببم. بەڵێ، ژاری کوشندە لەناو جانتاکەم دایە، ژاری یەکاویەک، ئەو ڕۆژەم لەبیرە کە خۆم لە جێی وێنەگرێک دانا و بە هەزار گێرەوکێشە کڕیم، نێو و ئادرەسی هەڵەشم دابوو. "سیانووری دووپتازیۆم" کە لە ناو کتێبی پزیشکیدا خوێندبوومەوە و نیشانەکانیم دەزانی، سەرەگێژە، هەناسە بڕکێ و گیاندان ئەگەر زگ بەتاڵ بێ، بیست گرەم لەو

ژارە یەکاویەک یا زۆر بگرێ لە دوو خولەکدا دەتکوژێ. بۆ ئەوەی کە بە هەوا خراپ نەبێ، لە بەرگی نۆقڵم پێچابوو و سەریم بە هێندێک مۆم گرتبوو و خستبوومە ناو شیشەیەکی بلوورین. کێشەکەی سەد گڕەم بوو و وەک گەوهەرێکی پڕبایەخ هەڵمگرتبوو. بەڵام بە خۆشحاڵییەوە، شتێکی باشترم دۆزییەوە. تریاکی قاچاخ، ئەویش لە پاریس. ئەو تریاکە کە لەمێژ بوو بە شوێنیەوە بووم، بە هەڵکەوت بە دەستم گەیشت. خوێندبوومەوە کە مردن بە تریاک، زۆر لە مردن بە ژاری سیانوور خۆشتر و هاسانترە. ئێستا بەڕاستی دەمەویست خۆم نەخۆش بکەم و دوایی تریاک بخۆم.

سیانووری دووپتازیۆمم کردەوە، لە قەراغەکەی کە شێوازی خڕی هەبوو و وەک هێلکە دەچوو، بە ئەندازەی دوو گڕەمم لێوەکرد. خستمە ناو دەفری بەتاڵ، بە چەسب لێوارەکەیم بەیەکەوە نووساند و خواردم، نیو کاتژمێر تێپەڕبوو، هەستم بە هیچ نەکرد. سەر ئەو دەفرەی کە سیانووری پێوە بوو، تامی سوێری هەبوو. دیسان هەڵمگرت. ئەوجار بە ئەندازەی پێنج گڕەمم لێوەکرد و دەفرەکەم لە گەرووم بردە خوار، ڕۆیشتم لە جێخەودا خەوتم، وا خەوتم کە ئیتر هەڵنەستمەوە.

ئەو بیرە، هەر مرۆڤێکی وریا و هۆشیاریش شێت دەکا، نا، هەستم بە هیچ نەکرد، ژاری کوشندە کاریگەری لەسەرم نەبوو. هێستا زیندووم، ژاریش لە ناو جانتاکەمدایە. من لەناو جێخەودا هەناسەم دەرنایە، بەڵام ئەوە بە هۆی ئەو ژارەوە نییە، من پتەو و قایم بووم و هیچ شتێک کاریگەری لەسەرم نییە ، هەر ئەوجۆرەی کە لە ئەفسانەکاندا کەسانێکی ئاوا هەن. جێی باوەڕ نییە، بەڵام دەبێ بڕۆم، بێهوودەیە، ژیانم بێبایەخ بووە، پووچ، بێسوود، دەبێ تا زووە خۆم دەرباز بکەم و بڕۆم. ئەوجار ئیتر گاڵتە نییە و هەرچەند کە بیر

دەکەمەوە، هیچ شتێک من بە ژیانەوە نابەستێتەوە، هیچ شتێک و هیچ کەسێک ..

لەبیرمە سێ ڕۆژ لەمەوبەر بوو، شێتانە لەناو ژوورەکەمدا پیاسەم دەکرد، لەمبەر بۆ ئەوبەر. جلی بە دیوارەوە هەڵاوەسراو، دەفری ڕووشۆری، ئاوێنەی ناو گەنجە، وێنەیەک کە بە دیوارەوەیە، جێخەو، مێزی ناو ژوورەکە، کتێب گەلێک کە لەسەری کەوتوون، کورسییەکان، پێڵاوێک کە لەژێر گەنجە داندراوە و جانتاکانی گۆشەی ژوورەکە، دوابەدوای یەکتر دەهاتنە پێش چاوم. بەڵام من هەستم پێنەدەکردن، یا سرنجم نەدەدانێ، بیرم لە چی دەکردەوە؟ نازانم، بێهوودە هەنگاوم هەڵدێنا، لەناکاو هاتمەوە سەرخۆ، ئەو جۆرە هەنگاو هەڵێنانەوە دڕندانەیەم لە شوێنێک بینیبوو و بیرمی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. نازانم کوێ، هاتەوە بیرم، لە باغچەی ئاژەڵانی بێرلین، یەکەم جار بوو کە گیانلەبەرە دڕندەکانم بینی، ئەو گیانلەبەرانەی لەناو قەفەسی خۆیاندا بەخەبەر بوون و هەروا بێهوودە بەڕێدا دەڕۆیشتن، دروست بەم شێوەیە. ئەوکاتە، منیش وەک ئەو گیانلەبەرانەم لێهاتبوو، ڕەنگە وەک ئەوانیشم بیر دەکردەوە، هەستم بەوە دەکرد کە وەک ئەوانم، ئەو ڕێگاڕۆیشتنە نەخوازراوە، سووڕان بە دەوری خۆمدا، کاتێک کە وەدیوار دەکەوتم، هەستم دەکرد کە بەربەستێکە و دەگەڕامەوە. ئەو گیانلەبەرانەش هەر ئەو کارە دەکەن ...

نازانم چ دەنووسم. کرتەکرتی کاتژمێر هەروا لە بن گوێم دەنگی دێ، حەز دەکەم هەڵیگرم ولە پەنجەرەوە فڕێی بدەمە دەر، ئەو دەنگە ترسناکە کە تێپەڕبوونی کاتی وەک چەکوچ لە سەرمدا دەکوتا.

حەوتوویەک بوو کە خۆم ئامادەی مردن دەکرد. هەرچی نووسراوە و کاغەزی هەمبوو، لە ناوم بردن. جلە پیسەکانم فڕێدا تا کاتێک دێن و شتەکان

دەپشکنن، شتی چڵکن و پیس نەدۆزنەوە. جلی ژێرم تازە کڕیبوو، لەبەرم کردن، تا کاتێک کە لە جێخەوم دەهێننە دەر و دوکتور دێ کە پشکنینم بۆ بکا، شیک و جوان بم. شیشەیەکی ئۆدکۆڵۆنم هەڵگرت، بە جێخەومدا پرژاند کە بۆنخۆش بێ. بەڵام چون هیچ کارێکم لە شێوەی هی کەسانی تر نەبوو، ئەوجارەش دیسان دڵنیا نەبووم، لە قایمی و پتەوی خۆم دەترسام، وەک ئەوە وابوو کە ئەوجارە، خاڵ و بردنەوە بە هاسانی نادەن بە کەس، دەمزانی کە کەس هەروا بە هاسانی نامرێ ...

وێنەی خزم و کەسەکانم دەرهێنا و چاوم لێکردن، هەرکامێکیان بە جۆرێک هاتنە بەرچاوم. هەم خۆشم دەویستن و هەم ناخۆش. دەمەویست بیانبینم و نەمدەویست، نا، ئەو یادگارییانە زۆر ڕووناک بوون، وێنەکانم دڕاند، هۆگری کەس نەبووم. خۆم هەڵسەنگاند و بینیم کە مرۆڤێکی ڕووخۆش نەبووم، من ڕووسارد، دڵڕەق و بێزار هاتوومە سەر دنیا، ڕەنگە لە سەرەتاوە وا نەبووم و ژیان و ڕۆژگار تا هێندێک منیان وا لێکرد. هەروەها هیچ لە مردن نەدەترسام. بە پێچەوانەوە، نەخۆشییەک، شێت بوونێکی تایبەت لە مندا وەدیار کەوتبوو کە بۆ لای موگناتیسی مەرگی دەکێشام. ئەوەش شتێکی تازە نییە. وەبیر نوکتەیەک هاتمەوە. پەیوەندی بە پێنج شەش ساڵ پێشە: لە تاران، ڕۆژێک بەیانیی زوو ڕۆیشتم بۆ شەقامی "شائاباد" تریاک لە دەوافرۆش بکڕم. پارەیەکی سێ تمەنیم لەپێش دانا و گوتم : بایی دوو قڕان تریاک. بە ڕیشێکی لە خەنەگرتوو و کڵاوێکی ئارەقگر کە بە سەرییەوە بوو، سڵاوەتی دەنارد. لە بنەوە چاوێکی لێکردم و وەک کەسێک کە لەڕووی سیماوە خەڵک دەناسێ، یا دەتگوت بیری منی زانی، گوتی: وردە پارەمان نییە. دوو قڕانییەکم دەرهێنا و دامێ، گوتی: نا، هەر نافرۆشم. هۆیەکەیم پرسی، جوابی دامەوە: ئێوە لاون و

نەزان، دەبینی لە ناکاو بە مێشکتاندا دێ کە تریاکەکەی بخۆن. منیش ئیتر پێم دانەگرت.

نا، کەس بڕیار بۆ خۆکوژی نادا، خۆکوژی هەر خۆی لەگەڵ هێندێک کەسە. هەوێنیانە و لە ناخیان دایە. بەڵێ، چارەنووسی هەرکەسێک لە ناوچاوانی نووسراوە، خۆکوژیش لەگەڵ هێندێک کەس لەدایک بووە. من هەمووکات گاڵتەم بە ژیان کردووە، دنیا، خەڵک، هەمووی وەک قومارۆچکە، شوورەیی، شتێکی پووچ و بێ مانایە. حەزم دەکرد بخەوم و ئیتر هەڵنەستمەوە و خەونیش نەبینم، بەڵام چون لای هەموو کەس خۆکوژی کارێکی سەیر و نامۆیە، دەمەویست خۆم بە توندی نەخۆش بکەم و بێتوانا و ناعیلاج بم و دوایی کە چاو و گوێی هەمووکەس پڕ بوو لە نەخۆش بوونی من، تریاک بخۆم تا بڵێن: نەخۆش کەوت و مرد.

لەناو جێخەودا خەریکی دەستنووس هەڵگرتنەوەم. کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆیە، دوو کەس هاتنە بینینم، ئێستا ڕۆیشتن، تەنیا ماوم. سەرم گێژ دەخوا. جەستەم ڕاحەت و ئاسوودەیە. زگم پیاڵەیەک شیر و چایی تێدایە، جەستەم شل و سستە و تینێکی ناخۆشی هەیە. دەنگی سازێکی خۆشم لە گرامافۆن بیستبوو، دێتەوە بیرم، دەمەوێ بە فیتە لێیدەم بەڵام ناتوانم. بریا دیسان دەمبیستەوە. ئێستا، نە دڵم بە ژیانەوەیە و نە ڕقیشم لێیەتی، بە نەخوازراوی زیندووم، بێ مەیل، هێزێکی نائاسایی ڕایگرتووم. لە بەندیخانەی ژیاندا، لەژێر زنجیری پۆڵادا بەستراومەوە. ئەگەر مردبام، دەیانبردمە مزگەوتی پاریس و لەوێ دەکەوتمە دەست عەرەبە پیرەکان، دیسان دەمردم، لە سیمایان بێزارم. بە هەر شێوە جیاوازییەکی نەبوو بۆ من، دوای ئەوەی کە دەمردم، ئەگەر منیان خستبا ناو چاڵی ئاودەستیش هەر بۆم

یەکسان بوو، ئاسوودە ببووم. تەنیا لە ماڵی شیوەن و زارییان بۆ دەکردم، وێنەکەمیان دێنا، ئاوازیان بۆ دەخوێندم، وە ئەو جۆرە کارە ناپەسەند و پیسانە کە باوە. هەموو ئەو شتانە بە ڕای من نەفامانە و پووچ بوون. هەڵبەت چەند کەسێک تاریفێکی زۆریان دەکردم، چەند کەس ڕەتیان دەکردەوە، بەڵام دواجار فەرامۆش دەکرام، لە ڕاستیدا من هەر خۆخواز و ناپەسەندم.

هەرچەند بیر دەکەمەوە، درێژەدان بەو ژیانە بێهوودەیە، من وەک پەتایەکی کۆمەڵگام، بوونەوەرێکی زیانبەخش، سەرباری کەسانی تر، هێندێک کات شێت دەبم، حەز دەکەم بڕۆمە شوێنێکی دوور، زۆر دوور، شوێنێک کە خۆم فەرامۆش بکەم. فەرامۆش بکرێم، ون بم، لەناو بچم، حەز دەکەم لەخۆم ڕابکەم و بڕۆمە شوێنێکی دوور، بۆ نموونە بڕۆمە "سیبێری"، لە ماڵی سازکراو لە دار، لە بن درەختی سنەوبەر، ئاسمانی ڕەنگ‌مردوو، بەفر، بەفرێکی زۆر لەنێوان تەختەدارەکان، بڕۆم درێژە بە ژیانی خۆم بدەم. یا، بڕۆمە "هێندوستان"، لە ژێر تیشکی هەتاو، دارستانی سەرلێکناو، لەناو خەڵکی سەیر و سەمەرە، بڕۆمە شوێنێک کە کەس نەمناسێ، کەس زمانم نەزانێ، حەز دەکەم لەناو خۆمدا هەست بە هەموو شتێک بکەم. بەڵام دەبینم کە من بۆ ئەو کارە نابم، نا، من سست و داهێزراوم، بە دنیا هاتنم هەڵە بووە، وەک تەختەدارێکی کە هەر دوو سەری پیسایی پێوەبێ، لە هەموو لایەک دەرکراوم. دەستم لە هەموو پلان و ئارەزووکانی خۆم هەڵگرت، لە ئەوین، لە جۆش و خرۆش، خۆم لە هەموو شتێک لادا. ئیتر ئێستا لە ڕیزی مردووکاندا دێمە ژمار.

هێندێک کات پلانی گەورە دادەڕێژم، خۆم شیاوی هەموو کار و هەموو شتێک دەزانم، لەگەڵ خۆمدا دەڵێم: بەڵێ، کەسانێک کە دەستیان لە گیان

هەڵگرتووە و لە هەموو شتێک بێزارن، تەنیا دەتوانن کاری گەورە ئەنجام بدەن. دوایی بەخۆم دەڵێم: بە چ دەردێک دەخوا؟ چ سوودێکی هەیە؟ شێتی، هەمووی شێتییە. نا، بڕۆ خۆت بکوژە، با لاشەکەت لەو ناوەدا بکەوێ، بڕۆ، تۆ بۆ ژیان نابی، کەمتر فەلسەفە بڵێ، بوونی تۆ هیچ بایەخێکی نییە، هیچت لەدەست نایە. بەڵام نازانم بۆ مەرگیش نازی بۆ کردم، بۆ نەهات؟ بۆ ناتوانم دەرباز بم و ئاسوودە بم؟ حەوتوویەک بوو خۆم ئەشکنجە دەدا، ئەوەش جوابەکەم بوو، ژار کاریگەر نەبوو، جێی باوەڕ نییە، ناتوانم باوەڕ بکەم، هیچم نەخوارد، خۆم سەرمابردوو کرد، سرکەم خوارد، هەموو شەو گومانم دەکرد کە نەخۆشی سیلم گرتوە، بەیانی کە هەڵدەستام حاڵم لە ڕۆژی پێشوو باشتر بوو. ئەوەی دەبێ بە کێ بڵێم؟ لەشم تەوی نەگرت، بەڵام خەونیش نەبوو، مادەی سرکەریشم نەکێشاوە، هەموویم زۆر باش لە بیرە، نا، جێی باوەڕ نییە.

ئەوانەم کە نووسی، ئاسوودە بووم، لاواندمییەوە، وەک ئەوەیە کە بارێکی قورسیان لەسەر شانم لابردبێ. بریا دەکرا کە هەموو شتێک بنووسرێ. بریا دەمتوانی بیر و باوەڕەکانم بە کەسێکی تر بفامێنم. نا، هەستگەڵێک هەیە، شتهایەک هەیە کە ناتوانی بە کەسێکی تری بفامێنی. ناتوانی بیڵێی، گاڵتەت پێدەکەن، هەرکەس بە پێوانی بیروڕای خۆی کەسی تر هەڵدەسەنگێنێ. زمانی مرۆڤ، وەک خۆی بێتوانا و ناتەواوە.

من پتەوم و هیچ شتێک کاریگەری لەسەرم نییە. ژار کاریگەر نەبوو، تریاکم خوارد، سوودی نەبوو. بەڵێ، من پتەو و قایم بووم، هیچ ژارێک ئیتر کاریگەر نابێ. دواجار بینیم کە زەحمەتەکانم هەموو پووچەڵ بۆوە. دوێنێ شەو بوو، بڕیارمدا تا لەوە زیاتر ئەو باسە بێتام نەبووە، تەواوی بکەم. ڕۆیشتم دەفری تریاکەکانم لە سندووقی مێزە بچووکەکە دەرهێنا. سێ دانە بوون،

نزیکەی بۆرییەکی تریاکی ئاسایی بوون. هەڵمگرتن، کاتژمێر حەوت بوو، لە خوارەوە داوای چاییم کرد، هێنایان و خواردمەوە، تا کاتژمێر هەشت کەس نەهاتەوە لام، دەرگام داخست و ڕۆیشتم لەپێش وێنەیەک کە بە دیوارەوە هەڵاوەسرابوو ڕاوەستام، ڕوانیم، نازانم چ بیرگەلێک هاتە مێشکم، بەڵام ئەوم وەک کەسێکی نامۆ هاتە بەرچاو، بەخۆمم گوت، ئەو کەسە چ پەیوەندییەکی لەگەڵ من هەیە؟ بەڵام ئەو سیمایەم دەناسی، زۆرم بینیبوو. دوایی گەڕامەوە، هەستم بە شۆڕش، ترس یا خۆشبوون نەدەکرد، هەموو ئەو کارانەی کە کردبوومن و ئەو کارەی کە دەمەویست بیکەم و هەموو شتێکی تر بە پووچی و بێهوودەیی هاتە بەرچاوم. سەراسەری ژیان بە ڕای من بێمانا بوو. تاوێک ڕوانیمە چواردەورەی ژوورەکەم. هەموو شتەکان لەسەر شوێنی خۆیان بوون. ڕۆیشتم و لەبەر ئاوێنە لەناو گەنجەدا چاوم لە سیمای گرژی خۆم کرد. چاوەکانم تا نیوە بەست، کەلێنی دەمم هێندێک کردەوە و سەرم بە شێوازی مردوو خوار کرد. لەناوخۆمدا گوتم، سبەی بەیانی، بەم شێوەیە دەبم، لە سەرەتادا هەرچەند کە لە دەرگا دەدەن کەس جواب ناداتەوە، تا نیوەڕۆ وادەزانن خەوتووم، دوایی قفڵی دەرگا دەشکێنن، دێنە ژوور و من بەو شێوازە دەبینن، هەموو ئەو بیرانە تیژ لەبەر چاوم تێپەڕ بوون.

لیوانی ئاوم هەڵگرت، بە لەسەرەخۆیی بەخۆمم گوت کە وەبزانە دەفری ئاسپرینە و دەفری یەکەمم قووت دا، دووهەمی و سێهەمیشم بە پەلەپەل دوا بەدوای یەک قووت دا. هەستم بە لەرزینێکی کەم کرد، دەمم بۆنی تریاکی گرت، دڵم هێندێک توندتر لێیدا، جگەرەکە کە تا نیوەم کێشابوو، لە سووتوودانم هاویشت. دوایی ڕۆیشتم حەبی بۆنخۆشم لە گیرفانم دەرهێنا و مشتم. دیسان خۆم لەبەر ئاوێنە بینی، ڕوانیمە چواردەورەی ژوورەکەم،

هەموو شتەکان لەسەر شوێنی خۆیان بوون. بەخۆم گوت: ئیتر ئەوجار تەواوە، سبەی ئەفلاتوونیش ناتوانێ زیندووم کاتەوە. جلەکانم لەسەر مێزی پێش جێخەوەکەم ڕێکوپێک کرد. لێفەم بەسەر خۆمدا کێشا، بۆنی ئۆدکۆلۆنی گرتبوو. کلیلی چرام سووڕاند، ژوورەکە تاریک بوو، لەتێک لە دیوار و ژێر جێخەو بە ڕووناکاییەکی مات و بێهێز کە لە پشت پەنجەرەوە دەهاتە ژوور، هێندێک ڕوون ببوو. ئیتر کارێکم نەمابوو، باش یا خراپ، ئەوەی دەبوو بیکەم، کردبووم. خەوتم، خزیم، هەر لەو خەیاڵەدا بووم کە نەکا کەسێک بێتە ئەحواڵپرسیم و پێداگری بکا. هەرچەند بە هەموو کەسم گوتبوو کە چەند شەوە خەوم لێنەکەوتووە تا ئاسوودەم بکەن و کاریان پێم نەبێ. لەوکاتەدا، زۆر وردبین ببووم. وەک ئەوەی کە ڕووداوێکی نائاساییم بۆ هاتبێتە پێش، یا سەفەرێکی خۆشم لەپێشدا بێ. دەمەویست بەباشی هەست بە مردن بکەم، بە تەواوی سرنجم دابوو، بەڵام گوێبیسی دەرێ بووم. هەر کە دەنگی هەنگاو دەهات، دڵم دادەخورپا. پەلکی چاوم پێکەوەنا. دە خولەک یا ڕەنگە زۆرتر تێپەڕ بوو و هیچ ڕووی نەدا. بە بیری جۆراوجۆر خۆم سەرقاڵ کردبوو، بەڵام نە لەو کارەی خۆم پەشیمان ببووم و نە دەشترسام، تا ئەوەی کە هەستم کرد تریاکەکە کاریگەری دەکا. لەسەرەتادا قورس بووم، هەستم بە ماندووبوون کرد، ماندوو بوونێک کە لە لای زگم زۆرتر هەستم پێدەکرد، وەک کاتێک کە خۆراک بە باشی هەرس نەبێ، دوایی ئەو ماندووبوونە گەیشتە سینگم و دواییش سەرم، دەستەکانم تەکان دا، چاوەکانم کردەوە، بینیم کە هەستەکانم بە باشی کار دەکەن، تینوو بووم، دەمم ویشک ببوو، زۆر بە ئەستەمی ئاوی زارم قووت دەدا، لێدانی دڵم خەریک بوو نزم دەبوو. هێندێک کات تێپەڕبوو، هەستم دەکرد هەوایەکی گەرم و خۆش لە جەستەم دەکەوتە دەر، زۆرتر لە شوێنە بەرزەکانی جەستەم بوو، وەک سەری

پەنجەکان، نوکی لووت و ...، لە هەمان کاتدا دەمزانی کە دەمەوێ خۆم بکوژم، ئەوەم هاتەوە بیر کە ئەو هەواڵە بۆ هێندێک کەس ناخۆشە، پێم سەیر بوو. هەموو ئەو شتانە لام منداڵانە و پووچ و پێکەنینی بوون. وام بیر دەکردەوە کە ئێستا ئیتر ئاسوودەم و بە ئاسوودەیی دەمرم، چ گرینگییەکی هەیە خەڵک خەم بخۆن یا نا، فرمێسک هەڵڕێژن یا نا. زۆرم حەز لێ بوو کە ئەو کارە سەر بگرێ و دەترسام کە نەکا بجووڵێمەوە یا بیرێک بکەمەوە کە پێش کاریگەری تریاک بگرم. هەموو ترسم ئەوە بوو کە نەکا دوای ئەوهەموو زەحمەتە، زیندوو بمێنمەوە. دەترسام کە گیانەدەرچوون ناخۆش بێ و لە بێهیواییدا هاوار بکەم یا داوای یارمەتی لە کەسێک بکەم، بەڵام گوتم هەرچەندیش ناخۆش بێ، تریاک دەمخەوێنێ و هەست بە هیچ ناکەم. خەوم لێدەکەوێ و ناتوانم لە شوێنی خۆم بجووڵێمەوە یا قسەیەک بکەم، دەرگاش لە پشتەوە داخراوە ...

بەڵێ، زۆر باش لەبیرمە، ئەوانە هاتن لە مێشکمەوە. دەنگی جێگیری کاتژمێرم دەبیست، دەنگی پێی خەڵکم دەبیست کە لە میوانخانەدا هەنگاویان هەڵدێنا. دەتگوت هەستی بیستنی من بەهێزتر بووە. هەستم دەکرد کە لەشم دەلەرزی، دەمم ویشک ببوو، کەمێکم سەرئێشە هەبوو، لە حاڵەتی بێهۆشی نزیک بووم، چاوەکانم نیوە کراوە بوون، هەناسەم جاری وایە توند و جاری وایە نزم دەبوو، لە هەموو درزەکانی جەستەم، ئەو گەرما خۆشە دەردەکەوت. وەک ئەوە وابوو کە منیش بە شوێنیەوەم، زۆرم حەز دەکرد کە توندتر بێ، لە خۆشییەکی زۆردا بووم، هەر بیرێکی حەزم لێبا دەمکرد، کاتێک دەجووڵامەوە، هەستم دەکرد کە پێش ڕۆیشتنەدەری ئەو گەرمایە دەگرێ، هەرچەند ڕاحەتتر خەوتبام باشتر بوو، دەستی ڕاستم لەژێر جەستەم

خستە دەر، خزیم، ئەوجار لەسەر پشت خەوتم، هێندێک ناخۆش بوو، دیسان کەوتمەوە حاڵەتی پێشتر و کاریگەری تریاک زۆرتر ببوو. دەمزانی و دەمەویست کە به باشی هەست بە مردن بکەم. هەستەکانم توندتر و گەورەتر ببوون. پێم سەیر بوو کە بۆ خەوم لێنەکەوتووە، وەک ئەوە وابوو کە هەموو بوونی من بە شێوازێکی خۆش لە جەستەم دەردەکەوت، دڵم بە ئەسپایی لێی دەدا، بە ئەسپایی هەناسەم هەڵدەکێشا، وابزانم دوو سێ کاتژمێر تێپەڕ بووە. لەو ناوەدا، کەسێک دەرگای کوتا، زانیم کە هاوسێکەمە بەڵام جوابم نەداوە و نەمەویست لە شوێنی خۆم بجووڵێمەوە. چاوم کردەوە و دیسان بەستم. دەنگی کرانەوەی دەرگای ژوورەکەیم بیست، دەستی شوشت، فیتەی لێدا، هەمووم بیست، هەوڵم دەدا بیری خۆش بێنمە مێشکم، بیرم لە ساڵی پار دەکردەوە، ئەو ڕۆژەی کە لە کەشتیدا دانیشتبووم و سازی دەستییان لێدەدا، شەپۆلی دەریا، جووڵەی کەشتی، کچێکی جوان کە ڕووبەڕووم دانیشتبوو، لە بیری خۆمدا نوقم ببووم، بەدوایدا هەڵدەهاتم، دەتگوت باڵم گرتبوو و لە ئاسماندا دەخولامەوە، سووک و چالاک ببووم، بە شێوەیەک کە بۆ باس نابێ. جیاوازییەکەی ئەوەیە کە تیشکێکی ڕووناکایی کە بە ئاسایی دەبینین، لە خۆشی تریاکدا وەک ئەوەیە کە هەر ئەو ڕووناکاییە لە پشت چلچرای ئاوێزانەوە یا ئاوێزەی بلوورەوە ببینن و دەبێتە چەند ڕەنگی جیاواز. لەو دۆخەدا، خەیاڵی سادە و پووچ کە دێتە ناو مێشکی مرۆڤ، هەروا ئەفسووناوی و سەرسووڕهێنەر دەبێ، هەر خەیاڵێکی تێپەڕاو و بێهوودە، سیمایەکی جوان و بەشکۆ بەخۆی دەگرێ، ئەگەر دیمەن یا ڕوانگەیەک بە بیردا تێپەڕ ببێ، زۆر گەورە دەبێتەوە، بۆشایی با دەکا، هەست بە تێپەڕبوونی کات ناکردرێ.

لەو کاتەدا زۆر قورس ببووم، هەست لە جەستەمدا شەپۆلی دەدا، بەڵام هەستم دەکرد کە خەوم لێنەکەوتووە. دوایین هەستێک کە لە کەیف و خۆشی تریاک لە بیرمە، ئەوە بوو: لاقەکانم سارد و بێهەست ببوون و جەستەم بێجووڵە، هەستم دەکرد کە دەڕۆم و دوور دەبمەوە، بەڵام هەرکە کاریگەرییەکەی تەواو بوو، خەم و پەژارەیەکی بێ کۆتایی دایگرتم، هەستم کرد کە هۆشم دێتەوە سەرخۆ. زۆر دژوار و ناخۆش بوو. سەرمام بوو، زیاتر لە نیو کاتژمێر زۆر بە توندی دەلەرزیم، دەنگی ددانەکانم دەبیست کە وێک دەکەوتن. دوایی تین دایگرتم، تینێکی گەرم و ئارەقە لە جەستەم تکاوە، دڵم دەگیرا، هەناسەبڕکێم بوو. یەکەم بیر کە هاتە مێشکم، ئەوە بوو کە هەموو شتێک پووچەڵ بۆوە و ئەوەی دەبوو ببێ، نەبوو و سەری نەگرت. لە گیان نەدانی خۆم زۆرتر سەرم سوڕمابوو، زانیم کە هێزێکی تاریک و چارەڕەشییەکی گەورە دژایەتیم دەکا.

بە دژواری هەستامە سەرپێ، کلیلی چرای کارەبام سووڕاند و هەڵایسا. نازانم بۆ دەستم بۆلای ئاوێنەیەکی بچووک ڕۆیشت کە لەسەر مێزی پەنا جێخەوەکە بوو، بینیم کە ڕوخسارم هەڵنووسابوو، ڕەنگم زەرد هەڵگەڕابوو، چاوم فرمێسکی لێ دەتکا، دڵم بە توندی دەگیرا، بەخۆم گوت، باشە لانی کەم دڵم لەکار کەوت. چرام کوژاندەوە و لە جێخەودا کەوتم.

نا، دڵم لەکار نەکەوت، ئەوڕۆ باشترە، نا، ئەوە شتێک نییە خراپ ببێ و لەناو بچێ. دوکتور هات، گوێی لە لێدانی دڵم گرت، ترپەی گرتم، چاوی لە زمانم کرد، گەرمیپێوی دانا، هەر ئەو کارە ئاساییانە کە هەموو دوکتورەکان دەیکەن و لە هەموو دنیا بە یەک شێوەیە. میوەخوێ و دەوای کینینی دامێ، هەر نەیزانی کە دەردی من چییە. هیچکەس ناتوانێ بزانێ من دەردم چییە،

ئەو دەوا و دەرمانە شتێکی پێکەنینین، لەسەر مێز، حەوت هەشت جۆرە دەرمانیان بۆ ڕیز کردووم، من پێدەکەنم، چ ئەکتەرخانەیەکە ئەو دنیایە ...

کرتەکرتی کاتژمێر هەروا لە بن گوێم دەنگی دێ، دەنگی کەڕەنای ئۆتۆمبیل و دووچەرخە لە دەرەوە دێ. چاو لە کاغەزی دیوار دەکەم، گەڵای باریکی بنەوش و پنجکی گوڵی سپی پێوەیە، لەسەر لقەکەی، مەودابەمەودا، دوو باڵندەی ڕەش بەرامبەری یەکتر هەڵنیشتوون. سەرم بەتاڵە و زگیشم برسییە و جەستەم ماندوو. ئەو ڕۆژنامانەی لەسەر گەنجەکەم داناون، بە شێوازێکی تایبەت لە شوێنی خۆیان ماون، کە چاو لێدەکەم، لەناکاو وەک ئەوە وایە کە هەموو ئەوانە بۆ من نامۆن، خۆم لە چاوی خۆمدا نامۆم، پێم سەیرە کە بۆ هێستا زیندووم؟ بۆ هەناسە دەکێشم؟ بۆ برسیم دەبێ؟ بۆ دەخۆم؟ بۆ دەڕۆم؟ بۆ لێرەم؟ ئەو خەڵکەی دەیانبینم کێن و چییان لێم دەوێ؟ ...

ئێستا زۆر باش خۆم دەناسم، هەرئەوجۆرەی کە هەم، بێ کەم و زیاد. هیچ کارێک ناتوانم ئەنجام بدەم، ماندوو و هیلاک لەسەر جێخەو کەوتووم، دەمبەدەم بیرەکانم دەگەڕێن، دەگەڕێن، لە هەمان بازنەی بێهیواییدا، بێزار بووم، بوونی خۆم تووشی سەرسووڕمانی کردووم، چەند تاڵ و ترسناکە کاتێک کە مرۆڤ هەست بە بوونی خۆی دەکا. چاو لە ئاوێنە دەکەم و بەخۆم پێدەکەنم، سیمای خۆم تا ئەو ڕادەیە نەناس و نامۆ و پێکەنینی هاتۆتە بەرچاو.

ئەو بیرۆکەیە چەندین جار هاتۆتە ناو مێشکمەوە،پتەو و نەمر بووم، ئەو کەسایەتی پتەوەی کە هیچ شتێک کاریگەری لەسەری نییە و لە ئەفسانەکاندا باسی دەکەن، وەک دۆخی منە. موعجزە بوو. ئێستا باوەڕ بە هەمووجۆرە خوڕافە و موعجزەیەک دەکەم. بیری سەیر و سەمەرە لە پێش چاوم تێپەڕ دەبن. ئێستا دەزانم کە خودا، دوو جۆرە مرۆڤی دروست

کردووە: خۆشبەخت و بەدبەخت. پشتیوانی ئەوانەی هەوەڵێ دەکا و ئازار و ئەشکنجەی دەستەی دووهەم بە دەست خۆیان زیاد دەکا. ئێستا باوەڕ دەکەم کە هێزێکی دڕندە و پەست، فریشتەیەکی چارەڕەشی، لەگەڵ هێندێک کەسە ...

دواجار بە تەنیا مامەوە، ئێستا دوکتور ڕۆیشت، کاغەز و قەڵەمم هەڵگرت، دەمهەوێ بنووسم، نازانم چی. یا هیچم نییە یا ئەوەی کە ئەوەندە زۆرە ناتوانم بینووسم. ئەوەش خۆی چارەڕەشییەکە. نازانم، ناتوانم بگریم، ڕەنگە گەر توانیبام بگریم، هێندێکی لاواندبامەوە. ناتوانم. وەک شێتانم لێ هاتووە. لە ئاوێنەدا بینیم کە مووی سەرم خڕ بۆتەوە و لێکالاوە، چاوەکانم کراوە و بێ حاڵەتن. بیر دەکەمەوە کە سیمای من نەدەبوو بەمجۆرە بێ، ڕوخساری زۆر کەس لەگەڵ بیر و ڕایان جیاوازە، ئەوە شتێکە کە زۆرتر گرژم دەکا. هەر ئەوەی دەزانم کە ڕقم لە خۆمە، دەخۆم، ڕقم لە خۆمە، دەڕۆم، ڕقم لە خۆمە، بیر دەکەمەوە، ڕقم لەخۆمە. چەند پێداگر! چەند ترسناک! نا، ئەوە هێزێک بوو لە سەرووی ئاستی مرۆڤ، نەخۆشییەک بوو، ئێستا باوەڕ بەو شتانە دەکەم. ئیتر هیچ شتێک کاریگەری لەسەرم نییە. سیانوورم خوارد کاریگەر نەبوو، تریاکم خوارد، دیسان هەر زیندووم، ئەگەر ئەژدیهاش هێرشم بۆ بکا، ئەژدیها دەمرێ. نا، کەس باوەڕ ناکا. ئایا ئەو ژارانە خراپ ببوون، ئایا بە ئەندازەی پێویست نەبوون؟ ئایا زۆرتر لە ئەندازەی پێویست بوون؟ ئایا پێوانەکەیم بە هەڵە لە کتێبی پزیشکیدا دۆزیبۆوە؟ ئایا دەستی من ژار دەگۆڕێ و دەیکاتە دەرمان؟ نازانم ئەو بیرانە چەند جار هاتنە ناو مێشکم، تازە نین بۆم، لە بیرمە کە بیستوومە کاتێک ئاگر لە دەوری دووپشک دابنێن، بەخۆیەوەدەدا، ئایا من بازنەیەکی ئاورم لە دەور نییە؟

لەپێش پەنجەرەی ژوورەکەم، لەسەر لێواری ڕەشی سێگۆشەی سەربان کە ئاوی باران لە کەلێنەکەیدا کۆ بۆتەوە، دوو چۆلەکە هەڵنیشتوون. یەکیان دندووکی دەخاتە ناو ئاو، سەری هەڵدێنێ، ئەوی تر، لەپەنا ئەو خۆی وێک هێنابوو و جەستەی خۆی دەپشکنی. من جووڵامەوە، هەردووکیان بەیەکەوە جیرِجیرِیان کرد و هەڵفڕین. ئاسمان هەوراوییە، هێندێک کات لە پشت پەڵەی هەورەوە هەتاوی سپیهەڵگەڕاو دەردەکەوێ، خانووەکانی بەرامبەرم، هەموو دووکەڵاوی، ڕەش و خەمهێنەر لە ژێر گوشاری ئەو کەشە قورس و بارانییەدا ماون. دەنگی دوور و کزی شار دەبیستری.

ئەو وەرەقە ناجسنانە کە فاڵم پێ گرتنەوە، ئەو وەرەقە درۆزنانە کە فریویان دام، لە سندووقی مێزەکەمدان. سەیرتر و پێکەنینیتر ئەوەیە کە هێستاش هەر فاڵیان پێ دەگرمەوە.

چیم پێ دەکرێ؟ چارەنووس لە من بەهێزترە.

بریا مرۆڤ هەر بەو تاقیکردنەوانەی کە لە ژیان هەیەتی، دەیتوانی دیسان بێتەدنیا و ژیانی خۆی بەڕێوەبباتەوە. بەڵام کام ژیان؟ ئایا بە دەست منە؟ چ سوودێکی هەیە؟ هێزێکی کوێر و ترسناک بەسەرماندا سوارە، کەسانێک هەن کە ئەستێرەیەکی شووم چارەنووسیان بەڕێوەدەبا، لەبن قورسایی ئەودا ورد دەبن و خۆشیان دەیانهەوێ کە ورد بن ...

ئێتر نە خەونێکم هەیە و نە ڕقێک، لەناو خۆمدا ئەوەی پەیوەندی بە مرۆڤەوە هەبێ، لە دەستم داوە، ونم کردووە، لە ژیاندا، دەبێ یا فریشتە بی، یا مرۆڤ وە یا حەیوان. من هیچکامیان نەبووم، ژیانم بۆ هەمیشە ون بوو، من خۆخواز، ناشارەزا و بێچارە هاتبوومە سەردنیا، ئێستا ئیتر مەحاڵە بگەڕێمەوە و

ڕێیەکی دیکە هەڵبژێرم. ئیتر ناتوانم بکەومە شوێن ئەو سێبەرە بێهوودانە، لەگەڵ ژیان لێکاڵێین، زۆران بازی بکەم. ئێوە کە گومان دەکەن بەڕاستی ژیان دەبەنە سەر، چ بەڵگە و لۆژیکێکی قایمتان لە بەردەست دایە؟ من ئیتر نە دەمەوێ ببەخشم و نە دەمەوێ ببەخشرێم. نە بۆ چەپ بڕۆم و نە بۆ ڕاست، دەمەوێ چاوم لەسەر داهاتوو ببەستم و ڕابردووش لەبیر بکەم.

نا، ناتوانم لەدەست چارەنووسی خۆم ڕابکەم. ئەو بیرگەلە شێتانەیە، ئەو هەستانە، ئەو خەیاڵە تێپەڕیوانەی دێنە مێشکم، ئایا ڕاستەقینە نین؟ بە هەر شێوە، لە بەرامبەر بیرە ئاقڵانەکانم، زۆر ئاسایی‌تر دێنە بەرچاو. وادەزانم کە ئازادم، بەڵام لە بەرامبەر چارەنووسی خۆمدا، ناتوانم کەمترین خۆڕاگری نیشان بدەم. لغاوی من بە دەست ئەوە، ئەوە کە من بۆ ئەملا و ئەولا دەکێشێ. پەستی، پەستی ژیان کە ناتوانن لە دەستی ڕابکەن، ناتوانن هاوار بکەن، ناتوانن دژایەتی بکەن، ژیانی نەفام ...

ئێستا ئیتر نە دەژیم و نە لە خەویش دام، نە حەزم لە هیچە و نە ڕقم لێیەتی، من لەگەڵ مەرگ ئاشنا و ئاوێتە بووم. ئەو تەنیا هاوڕێمە، تەنیا شتێکە کە دەملاوێنێتەوە. گۆڕستانی مناپارناسم دێتەوە بیر، ئیتر بەخیلی بە مردووکان نابەم، منیش لە دنیای ئەوانم. منیش لەگەڵ ئەوانم، کەسێکی زیندەبەگۆڕم ...

ماندوو بووم، چ شتهایەکی بێ کەڵکم نوسیوە؟ بەخۆم دەڵێم : بڕۆ شێتە، کاغەز و قەڵەم فڕێدە، فڕێیاندە شوێنێکی دوور، قسەی بێکەڵک بەسە، بێدەنگ بە، بیاندڕێنە، مەبادا ئەو نووسراوە بێکەڵکانە بگاتە دەست کەس، چۆنم هەڵدەسەنگێنن؟ بەڵام من شەرمم لە کەس نییە، گرینگی بە هیچ نادەم، پێدەکەنم بە دنیا و هەرچی تێیدایە، هەرچەند هەڵسەنگاندنی ئەوان بۆ من

وردتر بێ، نازانن کە من خۆمم وردتر و باشتر هەڵسەنگاندووە. ئەوان بە من پێدەکەنن، نازانن کە من زۆرتر بەوان پێدەکەنم، من لە خۆم و لە هەموو خوێنەرانی ئەو نووسراوە بێکەڵکانە بێزارم.

ئەو دەستنووسانە، لەگەڵ دەستەیەک وەرەقی قومار، لە سندووقی مێزەکەیدا بوون، بەڵام خۆی لە جێخەودا کەوتبوو و هەناسەکێشانی لە بیر چووبۆوە.

پاریس، ١١ ی ڕەشەمەی ١٣٠٨ی کۆچی هەتاوی.